



ناو: هاوسەرگیری سومبولی خۆشەویستی و هێلانەی وەفادارییە.

بابەت: کۆمەلایەتی.

نوسەر: ئــــارام نـبـی محمود

وەرگێر:

پێداچونەوە: م. حەسەنی شەقلاوە

کاری کۆمپیوتەر: نوسینگەی MOM ٠٧٥٠٤٨٩٠٧ ٢٦٤٨٩٠٧ ٠٦٦ /N.

پاك نوسکردن: نوسەر.

چاپخانە: ڕۆژ هەلات.

چاپ: یەکەم ٢٠١٢.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

ژمارەی بەرهەم: ١١٣

نرخ: ١٠٠٠ دینار.

بۆ: فرۆشتن و بلاوکردنەوە: ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ .M

بۆ: هونەرکاری وچاپکردن: ٠٧٥٠١١٨١٩١٩ / M.





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٨)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە.




# هاوسەرگیری
# سومبولی خۆشەویستی و
# هێلانەی وەفادارییە

ئـــارام نــبــی محمود

یەکەم چاپ
١٤٣٣ک - ٢٠١٢ز

- پێشکەشە:

بەو مرۆڤەی ڕێنیشاندەری ژیانمە، بە دایکی کۆچکردووم دایە نەخشین، بە خانەوادە خۆشەویستەکەم، بە هەموو ئەوانەی کە بوونەتە بەشێک لە یادگاری و بیرەوەرییەکانم، بە هەموو لاوێک کە نیازی هاوسەرگیری هەبێت بە مەبەستی دوور بوون لە گوناه، بە هەموو ژن و مێردێکی بەختەوەر، بەو کەسانەی یارمەتیان دام و هاندەرم بوون.

## • پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ هەژمار بۆ پەروەردگاری مەزنی بێ هاوتای جیهانیان، درود و سڵاوی خوا بڕژێتە سەر خۆشەویستمان و کۆتا پێغەمبەر موحەممەدﷺ وە گشت شوێنکەوتووانی هەتا ڕۆژی دوایی.

سوپاس بۆ خوا کە ئەم دەرفەتەی بۆ ڕەخساندم بۆ ئامادەکردن و نووسینی ئەم نامیلکەیە، تاکو لەو ڕێگەیەوە ئاماژە بە بابەتێکی گرنگ و کاریگەر و هەستیار بکەم کە ئەویش پرۆسەی هاوسەرگیرییە، بۆ ئەوەی هەموو لاوێکی موسڵمان تێبگات و بزانێت کە هاوسەرگیری چییە؟ ئامانج لە بەئەنجام گەیاندنی هاوسەرگیری چییە؟ کێ هەڵدەبژێرین وەکو هاوسەری ژین و ژیانمان؟.

ئـەوەی لـەوناميلكەيـە ئامـاژەی بـۆ كـراوە سەرەتايەكە بۆ چوونە ناو ژيـانی هاوسـەرگيری، تاكو هانی كوڕان و كچانمان بـدرێت بـۆ ئـەوەی بەسـەركەوتوويی بـچنە نـاو پرۆسـەكە و بەسەركەوتوويی ئەنجامی بدەن إنشاالله.

پرۆسەی هاوسەرگيری يەكێكە لە گرنگترين و ديارترين ڕووداو لە ژيـانی هـەموو مرۆڤێكـدا، هەنگاوێكە هەموو ژيـانی مـرۆڤ ديارىـدەكات و دەبێتە ناسنامەی، ئەگەر ئەو هـەنگاوە ژيرانـە و سـەركەوتوو بـوو ئـەوا ژيـانێكی بەختـەوەر و خێزانێكی سەركەوتوو پێكەوە دەنـێن، ئەگـەر وا نەبوو دەبێـت تـا كۆتـايی ژيانيـان بـاجی ئـەو هەڵەيە بدەن.

بۆيـە زۆر گرنگـە هـەموو كـچ و كوڕێـك زۆر ژيرانە و بە بەرچاو ڕوونيەوە ئەو هەنگاوە بنـێن و

کاری جددی بـۆ بکـەن، بـە کـارێکی بـچوک و سۆزداری سەیری نەکەن و لـە ژێـر کاریگـەری هەڵــچوونێکی کاتیـــدا خۆیـــان نەخەنـــە نـــاو تەنگەژەی کێشە خێزانی و کۆمەڵایەتیەکانەوە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم

واتـە: بەڵگەیـەکی دیکـەی گـەورەیی خـوا ئەوەیـــە کـــە هـــەر لـــە خۆتـــان هاوســـەری بـــۆ دروستکردوون بۆ ئەوەی ببن بە شـوێنی ئـارامی بۆتـان و لـە نێوانتانـدا خۆشەویـستی و سـۆز و میهرەبـانی فەراهـەمهێناوە، بەڕاسـتی ئالـە و

دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێک کـە بیردەکەنەوە و تێ دەفکرن.

خوای گەورە لەو ئایەتـە پیـرۆزەدا جـەخت لەسـەر خۆشەویستی و میهرەبانی دەکاتەوە لە نێوان هاوسەران تاکو لە ژیانیان ڕەچاوی یەکـسانی و دادوەری لەگـەڵ یەکتردا بکەن و خێزانێکی پڕ باوەڕو لەخوا ترسان پێک بهێنن.

هاوسـەرگیری پەیوەندییـەکی گرنگـی نێـوان مرۆڤەکانـە، گرنگیـدان بـەم پەیوەندییـە لەگـشت قۆناغەکانیدا پێویستە چ لە کاتی دەستنیـشان کردنـدا بێ، یان لە کاتی مارەکردن، یان لەکاتی دەستگیرانیدا، یان لەکاتی گواستنەوە.

لەخوای گەورە داواکارم تەقوامان پـێ ببەخـشێت و لەدینەکەی شارەزامان بکـات و ئـیخلاص بخاتـە دڵ و دەروونمان .

ئـــارام نـبـی محمود

١٤ رمضان ١٤٣١٢٤ / ٨ / ٢٠١٠

# تێگەیشتن لە مانای هاوسەرگیری

ئەمڕۆ کە شارستانیەت پەرەی سەندووە و بەگشتی خەڵک پێشکەوتووە، زۆربەی مەفهومەکان گۆڕاون هەرکارێک مەفهومێکی بنەڕەتی تازەی خۆی هەیە، بێگومان هەر یەکێکمان مەفهومێکی تایبەت بە خۆمان هەیە دەربارەی هاوسەرگیری، بەڵام ئێمەی موسڵمان بۆ ئەوەی تەواو لە مانا و مەبەستی هاوسەرگیری بگەین دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بزانین ئایینی پیرۆزی ئیسلام چ تێروانینێک و مەفهومێکی هەیە دەربارەی پرۆسەی هاوسەرگیری.

مەفهومی (تێگەیشتنی) بنەڕەتی هاوسەرگیری لە ئیسلامدا کۆن و نوێی بۆ نییە،

مــــەفهومی ئیـــــسلام لــــەم مەســـــەلەیەدا لـــــە مەفهومــەکانی تــری دونیــایی جیــاوازە چــونکە مەسەلەی هاوسەرگیری لـە قورئـان وەرگیـراوە قورئانیش ئەو یاسا و بەرنامــە خواییەیــە کــە بــۆ ئادەمیزاد دایڕشتووە.

ئەوەش بزانە یاسا و بەرنامەی ئیـسلام وشــە و واتای لەلایەن خواوە هاتووە وەکو قورئانی پیرۆز، یــان تــەنها واتــای لەلایــەن خــواوە هــاتووە و پێغەمبــەر(ﷺ) بەزمانــە شــیرینەکەی خــۆی وشەی بۆ داناوە وەکو حــەدیس، بەڵگەشــم ئــەو ئایەتە پیرۆزەی خوای گەورەیە کە دەفەرمووێت: [وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُـوَ إِلا وَحْـيٌ يُـوحَى] (النجم/ ٣-٤).

پێغەمبەر(ﷺ) لەخۆیەوە هیچ نــاڵێ، هەرچــی بیڵێ هەر لەلای خواوە پێی راگەیاندراوە.

کەوا بوو یاسای ئیسلام لە هەموو بوارێکەوە لە دوو سەرچاوە هەڵێنجراوە، جا هەرکەسێک لەو دوو سەرچاوەیە ئاو بخواتەوە هەرگیز گومڕا نابێ.

پرۆسەی هاوسەرگیری لە ڕوانگەی قورئانەوە واتە: دروستکردنی ژیان و پێکەوەنانی خێزان و خۆشەویستی و خزمایەتی و گرێدانی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە و خێزانەکان لەسەر بنەمای گرێبەستێکی پیرۆز و درێژەدان بە کاروانی ژیان و پێکەوەنانی ماڵ و منداڵ و پەروەردەکردنیان بەشێوەیەک کە ئەو منداڵانە لە داهاتوودا ببنە کەسێکی چاک و چالاک و لێهاتوو بۆ کۆمەڵ و مرۆڤایەتی.

بە ئەنجام گەیاندنی پرۆسەی هاوسەرگیری واجبە بۆکەسێک توانای دارایی و جەستەیی

هەبێت و گومانی نەبێت لەوەی کە ناتوانێت خۆی لە حەرام بپارێزێت، لەو حاڵەتەدا واجبە ئەو کەسە ژن بهێنێ یان شوو بکات بەپێچەوانەوە گوناهبار دەبێت.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾﴾ (النور/ ٣٢)

**واتە:** ئێوە هاوسەرگیری بکەن، ژن بدەن بە پیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بە شوو ئەگەر هەژاریش بن، ئەوە خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەر و دەوڵەمەندیان

دەکات خوای گەورەش هەمیشە فراونگیرو زانایە.

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە بارەی هاوسەرگیری لاوەکان ئاگادار دەکاتەوە و دەفەرمووێت: (يَامَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّومِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)[1]

واتە: ئەی کۆمەڵی لاوان هەرکەسێکتان توانای هاوسەرگیری هەیە با ئەنجامی بدات چونکە چاوەکانتان دەپارێزرێت لە تاوان و داوێنیشتان پاک ڕادەگرێت، هەرکەسێکیش نەیتوانی با ڕۆژوو بگرێت چونکە ڕۆژوو قەڵغانە.

هاوسەرێتی لە ئیسلامدا پێویستییەکی بنەڕەتی فیترییە، یاسایەکی زۆر بایەخ پێدراوە،

---

[1] - رواه البخاري ومسلم.

چــونکە ئیــسلام زۆر چــاک دەزانێــت کــە هاوسەرگیری کـارێکی وەهایـە نابێـت دەسـتی لێهــەڵبگرێت، بەســتراوە بــە مێــژووی دوور و درێژی بوونەوەرەوە، بوونەوەر لەسەر ئەم بناغەیە پێکهاتووە، هەروەک خوای گەورە دەفـەرمووێت:

﴿سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾﴾ (یس/٣٦)

**واتە:** پاکی و بێگەردی بـۆ ئـەو زاتـەی هـەر هــەموو بــەدیهێنراوەکانی بــەجووت دروســت کردووە لەوەی لەزەویدا دەڕوێت، لـە خۆیـشیان، لەو شتانەش کە نایزانن.

## هاندانی لاوان بۆ ژنهێنان و شووکردن

خوای گەورە لە قورئاندا باسی هاوسەرگیری کردووە و هانی ئەنجامدانی داوە، هەروەها پێغەمبەریش(ﷺ) لەفەرمایشتە جوانەکانی باسی هاوسەرگیری کردووە و هانیشی داوین بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم پرۆسەیە.

گەر سەیرێکی ژیاننامەی هەریەک لە هاوەڵە بەڕێزەکان و شوێنکەوتووانی پێغەمبەرﷺ بکەین دەبینین کە گرینگی تەواویان بە هاوسەرگیری داوە، چۆن خوا و پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کردوە ئەواش جێبەجێیان کردووە.

خــــوای گـــەورە دەفـــەرمووێت: ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾﴾ (النور/ ٣٢)

**واتە:** ئێوە هاوسەرگیری بکەن، ژن بدەن بــە پیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشــوو ئەگــەر هــەژاریش بــن، ئــەوە خــوا لــە فــەزڵ و بەخشـــشی خــۆی بـــەهرەوەر و دەوڵەمەنـــدیان دەکــات خــوای گــەورەش هەمیــشە فراونگیــرو زانایە.

ئەگەر ئێمە لەم ئایەتەدا وردبینەوە و بەجوانی تێبگەین دەبینین کە خوای گەورە باســی ئــەو کەسانەی کردووە کەوا هەژارن، ئێمــە هــەرگیز

نابێت لە هەژاری بترسین و بڵێین هاوسەرگیری ناکەین، چونکە ئێمە خاوەنی خوایەکی دەوڵەمەند و بەخشندەین، خوایەک کە لەسەر خۆی فەرز کردووە یارمەتی ئەوکەسە بدات کە دەیەوێت هاوسەرگیری بکات بە مەبەستی دووربوون لە گوناه و داوێن پیسی.

لەم بارەیەوە ئیمامی عەلی(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: ژن بهێنن بۆ ئەوەی دەوڵەمەندی بەدەست بێنن.

عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێت: (أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ التَّبَتُّلِ)[٢].

**واته**: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژیانی ڕەبەنی و ژن نەهێنانی قەدەغە کردووە.

---

[٢] - راوه الترمذي والنسائي

جا ئـەو کەسـانەی نایانـەوێ ژن بهێـنن یـان شـووبکەن و داوێنیـان لەخراپـەکاری بپـارێزن، ئەوانە لە ڕاستە ڕێی خوا لایانداوە.

خـوای گـەورە لـەبارەی فـەزڵی ژنهێنـان و شووکردن، دانـانی ژن و پیـاو بەیـەک جەسـتە لەژێر یەک پۆشـاکدا دەفـەرموویت: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ (البقرة/ ١٨٧).

**واتە**: خێزانەکانتان پۆشاکن بۆ ئێوە و ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان.

ژن و مێـرد داپۆشـەری یـەکترن، لـەبارەی جەستەییدا کە دەبنە پارێزەری داوێن و ئەندامی لەشیان لە گوناه و تـاوان، هـەروەها داپۆشـەری گیانی و دەروونین بۆ یەکتری، هیچ کەسێکیش وەک ژن و مێرد داپۆشەری یـەکترنین، چـونکە

هەردووکیان دەبنە پاسەوانی پاراستنی سومعە و ماڵ و سامان و نەفس و نهێنی یەکتری.

ئــەو کەســـانەی ژن نــاهێنن و توانـــای ژن هێنانیشیان هەیە دیـارە ئەوانــە بیـر لــە داوێــن پیسی دەکەنەوە، داوێن پیسیش مـرۆڤ لەســەر ڕێی ئیمان دوور دەخاتەوە، ئەو موسـڵمانەی کــە ژن نـــاهێنێ یـــان شـــوو ناکـــات، بێگومـــان لەدینەکـەی تێنەگەیـشتووە و ناشـارەزایە، بـــا باش بزانێ ئـەو جـۆرە کەسـانە نقـومی گونـاە و تاوانن، بۆ ئاگادارکردنەوەشیان ئـەم گووتەیـەی (ئیبن مەسعود) دەخەینە ڕوو کە دەڵـێ: "گــەر لە تەمەنم دە ڕۆژ بمێنێ حەز دەکەم ژن بهێــنم بۆ ئەوەی کە مـردم بـەبێ ژن نەچـمە خزمـەت خوای بـەرز و مـەزن". ئـەم گووتەیـەی (ئیبـن مەسـعود) لــەوەوە سەرچـاوەی گــرت کاتێــک

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خراپترین کەس ئەوانەن کە ژن ناهێنن و شووناکەن ).

جا لێرەدا ئامۆژگاری گشت دایک و باوکێکی خۆشەویست دەکەم و دەڵێم: گەر منداڵەکەت بالغ بوو، هەروەها توانای هاوسەر گرتنی هەبوو، ئەوا دەربارەی هاوسەرگیری قسەی لەگەڵدا بکە، یارمەتی بدە و هانی بدە، کەسێکی دیندار و بەڕەوشتی بۆ دەستنیشان بکە، جا منداڵەکەت کچ بێت یان کوڕ، ئا ئەمە شێوازێکە بۆ پاک ڕاگرتنی ژیان و پاڵنانی بۆ ڕێیەکی ڕاست و دروست.

جا کە دەڵێم توانای هاوسەرگیری مەبەستم ئەوەیە: ڕەنگە ئەو کچە یا ئەو کوڕە کاتی ئەوەی نەهاتبێت هاوسەر پێکەوەبنێت و پەلەی کردبێت، یان توانای بەڕێوە بردنی ماڵ نەبێت،

یان توانای جنسی نەبێت، یان کەم ئەقلە و ناتوانێت بەپێی پێویست هاوسەرکەی ڕازی بکات و منداڵەکانی بەخێو بکات... یان... هتد.

## هەڵبژاردنی هاوسەری چاك

هاوسەرگیری چەند قۆناغێکە یەکێک لە گرنگترین قۆناغەکانی ئەم پرۆسەیە هەڵبژاردنی هاوسەرە، بۆیە پێویستە لاوان و گەنجانی خۆشەویستمان لەکاتی دەست نیشان کردن و هەڵبژاردنی هاوسەردا جڵەو بدەنە ئەقڵ نەوەک هەست و سۆز، بە واتایەکی تر لە کاتی هەڵبژاردنی هاوسەردا ئەقڵ خاوەن بڕیار بێت نەوەک ئارەزوو،(نەفس) چونکە زۆربەی زۆری ئەو گیروگرفتانەی دێنە پێش ژنهێنان و شووکردن، بە هۆی هەڵبژاردنی هاوسەری ژینە بەبێ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و سۆراغ کردن، چەند کوڕ و کچی لاو هەبوون پەلەیان لە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەیان کردووە، کە

بەهۆیەوە تووشی نەگبەتی و ماڵ وێرانی و بەدبەختی بوون.

ئیسلام هانی ئەوەی داوە و گرنگیشی پێ دەدات کە ئەو کەسەی هاوسەر هەڵدەبژێرێ دەبێت خاوەن دین و ڕەوشت و داوێن پاکی بێت، هەروەها خاوەن ئیمانێکی پتەو بێ و ملکەچی یاساکانی قورئان بێ.

لە ئیسلامدا ماڵ و سامان، ناو و شۆرەت، شەهادە، ڕەچەڵەک و دەسەڵاتداری، هیچ نرخێکی بۆ دانانرێ، نموونەشمان لەم بارەیەوە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک فاتیمەی کچی بەشوود دای بە ئیمامی عەلی(ﷺ)، کە ئەو کات ئیمامی عەلی مارەییشی نەبوو بیدات بە فاتیمە، لە صەحابەکانیش(عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف خوشکی خۆی دا بە بیلالی حەبەشی.

دەقـــی فـــەرموودەی پێغەمبـــەر(ﷺ) هەیـــە دەربارەی ڕەچاو نـەکردنی هـیچ پلـە و پایـەک، تەنها دین و ڕەوشـت نـەبێ، وەک دەفـەرمووێ: (إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَـوْنَ دِينَـهُ وَخُلُقَـهُ فَزَوِّجُـوهُ إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ)[٣].

**واتە:** گەر یەکێک خوازبێنی کچەکەتانی کرد ئێوەش لەئایین و خورەوشـتی ڕازی بـوون ئـەوا بیدەنێ، گەر نەیدەنێ ئەوا فیتنـە و خراپـەکاری لەسەر زەوی بڵاودەبێتەوە.

هـەروەها دەفـەرمووێ: (تُـنْكَحُ الْمَـرْأَةُ لِأَرْبَـعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلَدِينِهَا، وَلِجَمَالِهَـا، فَـاظْفَرْ بِـذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)[٤].

**واتە:** ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەکرێت و دەهێنـرێ: لەبـەر مـاڵ و سـامان، یـان لەبـەر

---

[٣] - راوه الترمذی

[٤] - (متفق علیه)

ڕەچەڵەک و ناوداری، یان لەبەر دین و ڕەوشتی ئافرەتەکە، یان لەبەر جوانی و شۆخ و شەنگی ئافرەتەکە، ئەو ئافرەتە بخوازە کە خاوەن دین و ڕەوشتە، ئەگەر وانەکەیت دەستت بە قوڕ دادەچێ.

ئەو کات ژیانیان لێ تاڵ و ڕەنگە کار بگاتە لێک جیابونەوە، بۆیە پێویستە کچان و کوڕانمان ئامەدیی تەواویان هەبێت لەهەمو رویەکەوە بۆ چوونە نێو ژیانی هاوسەرگیری، تاکو ژیانێکی هاوسەری پڕ لە کامەرانی و ئاسودەیی پێک بهێنێت.

مەبەست لە وشەی دین تێگەیشتنە لە هەقیقەتی ئیسلام و پەیرەوکردنی کردەوە چاکەکان و ئاکارە جوان و بەرزەکان بە کردەوە، مەبەست ئەوەیە ئەو کەسەی هەڵیدەبژێری

پابەنـد بـێ بـە ئـایینی پیـرۆزی ئیـسلامەوە بـە شـێوەیەکی گـشتی لـە کـردار و گوفتـاردا و شـایەتی بـۆ بـدرێت لـە لایـەن کەسـانی بـاوەڕ پێکراوەوە، ئەو کاتە شـایەنی ئـەوە دەبێـت پێـی بوترێت خاوەن دین و خاوەن خوڕەوشتی بـەرز.. بـەڵام ئەگـەر لـە ئاسـتی ئـەو پابەنـدبوون و پەیڕەوکردن و تێگەیشتنەدا نەبێت ئەوا بێگومان حوکمی لادان و پابەندنەبوون و دوور لە ئیـسلام دەدرێت بەسەریدا، هەرچەندە لای خەڵک خۆی وا پیـشان بـدات کـە پابەنـدە بـە ئیـسلامەوە و خاوەن تەقوایە.

پێغەمبـەر(ﷺ) دیـن و ڕەوشـتی کردۆتـە مەرجی سەرەکی هاوسـەرگیری، لەبـەر ئـەوەی دین گرنگترین مەرجە بۆ ئەو پیـاوەی پابەنـدی فەرمانەکانی ئیسلام بێ و شتێکیش کە قەدەغـە

کرابێ خۆی لێ دوور دەخاتەوە، ئەوا ئەو پیاوە هەڵسوکەوت و مامەڵە و ڕەفتاری بەرامبەر خێزانەکەی چاک و باش دەبێت و ڕێزی دەگرێ و خۆشیدەوێ و دەبێتە پارێزگاری خێزانەکەی لە هەموو بوارەکاندا.

ئافرەتێکیش خاوەن دین و ڕەوشت بێ ئەوا ئارەزووی نەفس کاری تێ ناکات و چەواشەی ناکات و خۆیشی بەرامبەر بە نەفس سوک دانانێ و کاروباری ناوماڵ فەرامۆش ناکات و لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا و لە مافەکانی مێردەکەی بێ ئاگا نابێ.

با ئەوەش بزانین کاتێک کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ : ژن بۆ جوانی مارە دەکرێ، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە هیچ ڕەچاوی جوانی نەکرێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە نابێ تەنها

جوانی بکرێتە مەرج، ئەگینا جوانیش ئیعتیباری خۆی هەیە.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێت: ﴿ٱلْخَبِيثَـٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَـٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَـٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَـٰتِ ۚ﴾ (النور/٢٦)

**واتە**: ژنانی ناپاک بۆ پیاوانی ناپاک و پیـاوانی ناپوخت بۆ ژنانی ناپوخت، ئافرەتانی پـاکیش بـۆ پیاوانی پاک، پیاوانی پاکیش بۆ ئافرەتانی پاک.

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵـێ: نـابێ پیاوی موسڵمان و داوێـن پـاک ئـافرەتی داوێـن پیس مارە بکات، چـونکە مارەییەکـەی دروسـت نیە تا ئەو کاتەی ئافرەتەکە تەوبە دەکـات، گـەر تەوبەی کرد ئەوا ئـەو کاتـە مـارەیی ئافرەتەکـە دروستە.

هەروەها نابێ و دروست نیە ئافرەتێکی موسڵمان و داوێن پاک و بەڕەوشت بدرێتە پیاوێکی خراپەکار و فاسق.

جێگەی داخ و دڵگرانییە کە ئەم پێوانەیە لەلای زۆربەی خێزاناندا هیچ نرخ و بایەخی نیە، گەر پێیان بڵێی: ئەو کەسەی هاتووە بۆ داخوازی کچەکەتان نوێژ ناکات، یان عارەق و شتی سەرخۆشکەر دەخوات، یان بیروباوەڕی ئەم کوڕە پیس و خراپە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ، ئەوا بەشتێکی بچووکی دادەنێن و گوێی پێ نادەن، بەڵام کە پێت گووتن: ئەم کوڕە حاڵەتی ماددی باش نیە یان مام ناوەندە، ئەوا یەکسەر هاواریان لێ هەڵدەستێ و نەرێ دەکەن، هەرچەندە کوڕە موسڵمان و باش و ڕێک و پێک و خاوەن ڕەوشتێکی باش بێت،

بەڵام ماڵ وێرانی و بەدبەختی و ژیـان تـاڵی بـۆ ئەو کچەی کە شوو بەو جۆرە پیاوە دەکـات کـە ئــەم ســیفەتە جوانانــەی ئیــسلامی تێدانیــە، لەهەمان کاتدا ژیانی کچەکە دەکەوێتە مەترسی و کارەسات و ئـاژاوە و خراپەکاریەوە ئەویش بـە هـۆی پەیوەسـتی بـەو پیـاوە داوێـن پـیس و بەدڕەوشتە.

جا ئەگەر ئافرەتەکە دیندار بێ یان بـە هـۆی ئەنجامدانی شـتە حەرامەکانـەوە دینەکـەی لـە دەسـت دەدات، یـان ژیـانێکی کولەمـەرگی ناخۆش بەسەر دەبات.

چ بەڵا و فیتنەیەک لەوە گەورەترە بـۆ سـەر ئـایین و پـەروەردە و ڕەوشـت کـە ئـافرەتی موسوڵمان بکەوێتە ژێر چنگی پیاوێکی گومڕا و بەدڕەوشت، کە بە زۆری ناچاری بکات بـەرەڵابێ

و تێکەڵاوی پیاوانی نامەحرەم بێ، ناچـار بکـرێ مــەی و عــارەق و مــاددە سەرخۆشــکەرەکان بخواتەوە، ناچار بکرێ ڕەشبەڵەک بکا، هــەروەها مێزدێک بەرامبەر بە ئافرەتێکی ئیماندار کە هیچ ڕێزێک دانەنێ بۆ پاراستنی شەرەف و کەرامەتی و بەبێ نرخ تەماشای بکات!!!.

دەگێڕنەوە کچێک شووی بــە کــوڕێکی مــەی خۆرکرد، کاتێک کوڕەکە ئەم کچەی گواســتەوە بــۆ بەســەربردنی مــانگی هــەنگوینی چــوون بــۆ لوبنان و لە یــەکێک لــە ئوتێڵــەکانی ئــەو وڵاتــە دابەزین، کوڕەکە زۆری لەکچەکە کرد تــا مــەی بخواتــــەوە، کـــچەکەش مــــەی خـــواردەوە و هەردووکیان سەرخۆش بوون، جا پــێش ئــەوەی کوڕەکە بچێتە لای کچەکە بەنیازی جووتبــوون، بە هەر مەبەستێک بێــت کــچەکە لەژوورەکــەی

خۆیان چووە دەرەوە، کە گەڕایەوە ویستی بچێ بۆ ژوورەکەی خۆیان بەڵام لە بەر ئەوەی سەرخۆش بوو چووە ژوورێکی تر کە پیاوێکی بە تەنهای تێدابوو، جا پیاوەکە پەلاماریدا و داوێن پیسی لەگەڵدا کرد، تا بەیانی ئافرەتە تازە بووکەکە لەلای مایەوە، مێردەکەشی لەبەر سەرخۆشی خەوی لێکەوتبوو ئاگای لە ژنەکەی نەمابوو.

ئەمەیە سەرئەنجامی ئەو خێزانانەی کە کچ بەشوو دەدەن نازانن کوڕە کێیە؟ لەکوێ هاتووە؟ تەنها لەبەر ماڵ و سامان کچەکەی پێشکەش دەکات !!!.

پێویستە ئەوە بزانین ئافرەتیش مافی هەڵبژاردنی هەیە، مافی بڕیاردانی هەیە، مافی ئەوەی هەیە کە هاوسەری ژیان و ژینی بەدڵی

خـــۆی دەستنیـــشان بکـــات، پێغەمبـــەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (لاتُنكح الأيِّم حتى تُستأمَر ولاتُـنكح البكـرُ حتـى تـستأذن، قـالوا: يـا رسـول الله وكيـف إذنُها؟ قال: أَن تَسكُت)[٥] .

**واتــە:** ئــەو ئافرەتــەی کــە بێوەژنــە مــارەیی نابڕدرێ تـــا خۆی بڕیار نەدات، کچیش مـــارەیی دروست نییە و مارەیی نابڕدرێ تا ئیزن و ڕەئـــی لێ وەرنەگیرێ، گووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئیزنی چـۆن لـــێ وەردەگیـــرێ؟ پێغەمبــەر(ﷺ) فـــەرمووی: بـــێ دەنگیەکـــەی نیـــشانەی ڕازی بوونیەتی.

بە چاکمان زانی لێرەدا چـەند ئامۆژگارییـەک بخەینە ڕوو بۆ لاوان بۆ هەڵبژاردنی هاوسەرێکی چاک و باش و بەڕەوشت، هاوســەرێکی لــە خــوا

[٥] - (متفق عليه)

ترس و پارێزکار، هاوسەرێک کە خۆشەویستی خوا بێت:

١-وەکو ئاماژەمان پێدا دین و ڕەوشت با مەرجی سەرەکی هاوسەرگیری بێت.

٢- کچی دایکێکی چاک و بڕوادار بخوازە چونکە بێ گومان دایکی چاک هەردەم دەبێتە مایەی چاکبوونی کچەکەی، هەروەها لە خێزانێکی خاوەن ڕێز و خانەدان بێ و بنەماڵەیەکی بە شەرەف و ناسراو بن بە چاکی ڕەوشتیان.

٣- هاوسەرگیری ژن و پیاو هاوبەشییەکی ژیانی و گوزەرانییە، بۆیە کەسێک هەڵبژێرە کە لەگەڵ سروشت(طبیعة) و خوڕەوشتتدا بگونجێ، واتە کەسێک هەڵبژێرە کە هاوکوفی خۆت بێت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (تَخَـيَّرُوا لِـنُطَفِكُمْ وَانْكِحُوا الأَكْفَاءَ )[6].

**واتــە**: ئافرەتــانی گونجــاو بــۆ نوتفــەکانتان هەڵبژێرن، وە با هاوکوفی خۆتان بن.

٤- یــەکێکی تــر لــە ئاراســتەکردنە پــڕ لــە حیکمەتەکانی ئیسلام بــۆ هەڵبــژاردنی هاوســەر ئەوەیــە فــەزڵی ئــافرەتی بێگانــەی داوە بەســەر ئافرەتانی خزم، بۆ بە تەنگــەوە چــوونی ڕەســەنی منداڵ و دەســتەبەرکردنی ســاغ و ســەلامەتی و پاراســتنی جەســتەی لــە نەخۆشــیە بۆمــاوە و درمەکان، هــەروەها فــراوان بــوونی پەیوەنــدی و یەکترناسین لە نێــوان خانــەوادەکان و بــەهێزی پەیوەندی کۆمەڵایەتیان.

[6] - راوه إبن ماجه.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: لە خزمە نزیکەکانتان ژن مەخوازن، چونکە منداڵەکانتان لاواز و نازیرەک دەبن.

زانستی بۆماوەزانی دەریخستووە کە خواستنی ئافرەتی خزم دەبێتە هۆی لاوازی و بێ هێزی منداڵ لە ڕووی جەستەییەوە، هەروەها زیرەکیشی کەمتری تێدا دەردەکەوێت.

**٥**- هاوسەر کچ بێت چاکترە نەک بێوەژن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کچان مارە بکەن و بیان کەنە هاوسەری خۆتان، چونکە قسە و گەمەیان خۆشە و منداڵی زۆریان دەبێ و بە کەم قەناعەت دەکەن و ڕازین بە بەشی خۆیان.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی کردووە بەوەی کە کچان خۆشەویستیان زیاترە بۆ مێرد

و زیاتر بە پەرۆشەوەن بۆ چاک ڕاگرتنی خۆیان و ئابروویان.

بەڕاستی ئەگەر بێت و لاوان پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکەن لەکات و ساتی هەڵبژاردنی هاوسەردا، ئەوا بێگومان گیروگرفت ئێجگار کەم دەبێتەوە، ماڵ وێرانی و بەدبەختی گەلێک کەم دەبێتەوە، لەوەش زیاتر ماڵ و خێزان دەبنە بەهەشتێک خۆیان و منداڵەکانیان تیایدا هێمنترین و بەتامترین و خۆشترین ژیان دەبەنە سەر.

پیاو حەساوە ، ئافرەت گەشاوە، منداڵ ئاسوودەیە و بە گوڕوتینەوە پێشوازی لە ژیان دەکات، ئەو کات منداڵێکی بەکەڵک و سوودبەخش دەردەچێت هەم بۆ خێزان هەم بۆ کۆمەڵگە.

## سوودەکانی هاوسەرگیری

هاوسەرگیری یەکێکە لە ناز و نیعمەتەکانی خوا بەسەر بەندەکانیەوە، هەروەها هاوسەرگیری لە ڕێبازی پێغەمبەرانە عليهم السلام وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً﴾ (الرعد/٣٨)

**واتە**: سوێند بە خوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کردووە و هاوسەر و نەوەشمان پێداون.

هاوسەرگیری سوودی زۆری هەیە بۆ تاک و بۆ کۆمەڵگە، هەروەها سوودی ماددی و مەعنەوی هەیە، سەرەڕای سوودی دونیایی

سوودی قیامەتیشی هەیـە، لێـرەدا بـەپێی توانـا ئاماژە بۆ سوودەکانی هاوسەرگیری دەکەین:

١- پاراسـتنی کۆمەڵگـە لـە بەدڕەوشـتی، بـە هاوسـەرگیری کۆمەڵگـە لـە بەدڕەوشـتی دەپارێزرێـت تاکـەکانی کۆمەڵگـە لـە فەسـادی کۆمەڵایـەتی سـەلامەت دەبـن، چـونکە بـە هاوسـەرگیری حـەز و ئـارەزوو تێـر دەکرێـت و ئاگری لەش و دەروون دادەمرکێتەوە.

هـەروەها کۆمەڵگـە لـەو دەرد و نەخۆشـییە کوشندانە ڕزگار دەکات کـە لـە ڕێگـەی داوێـن پیسییەوە بڵاو دەبێتەوە، بۆیە پێویستە لـە سـەر حکومـەت و کۆمەڵگـە یارمـەتی لاوان بـدەن و ئاسـانکارییان بـۆ بکـەن بـۆ ئـەوەی پرۆسـەی هاوسەرگیری بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدەن.

٢- هاوسەرگیری بەدەستهێنانی باشترین خێرو خۆشی دونیایە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِها الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ)[٧].

**واتە**: ژیانی دونیا ڕابواردن و خۆشییە چاکترین خۆشی دونیاش ئافرەتێکی (صالحە)یە ژنێکی خاوەن ئیمان و تەقوایە".

٣- (الزواج نصف الدين) أو (الزواج شطر الايمان) هاوسەرگیری نیوەی ئیمانە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر بەندەی خوان ژن بهێنێ یان شوو بکات ئەوا نیوەی ئیمان و دینەکەی تەواو کردووە، با لە خواش بترسێ و خۆی لە گوناه و تاوان بپارێزێ لە تەواوکردنی نیوەکەی تر).

[٧] - راوه مسلم.

٤- هاوسەرگیری هۆکارێکە بۆ بە دەستهێنانی پاڵپشتی و ڕەزامەندی خوای گەورە وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (سێ کەس هەن مافیان بەسەر خواوە هەیە کە پاڵپشتیان بکات و یارمەتیان بدات، یەکێک لەوانە ئەو کەسەی کە هاوسەر پێکەوە دەنێ بە مەبەستی داوێن پاکی).

٥- هاوسەرگیری ئارامی و هۆگری گیان و دەروونە، بە هۆی ژنهێنان و شووکردنەوە پەیوەندی خۆشەویستی و سۆزبەخشی دەکەوێتە نێوان ژن و مێردەوە و هۆگری یەکتر دەبن، چونکە هەریەکەیان ئارامی و بەختیاری خۆی لە ژێر سایەی ئەوی تردا بەدی دەکات.

٦- بە هۆی هاوسەرگیرییەوە سۆزی دایکایەتی و باوکایەتی لە ناخی مرۆڤدا بە جۆشەوە ڕادەچڵەکێت، هەست و نەست

بەرامبەر جگەرگۆشەکان وەکو خونچە دەکرێتەوە و بۆنی پەرش و بڵاودەبێتەوە.

هەموو کەسێکی ژیر و عاقڵ دەزانێ ئەو سۆزە چۆن پاڵ بەدایک و باوکەوە دەنێت کە تێبکۆشن بۆ پێگەیاندن و دەستگرتنی جگەرگۆشەکانیان بەرەو ژیانێکی پڕ لە کارامەیی، بەرەو دوارۆژێکی پرشنگدار، بەرەو رەفتار و ئاکاری پاکی مرۆڤانە.

دەبێ ئەوەش بزانین ئەو سۆزی دایکایەتی و باوکایەتییە مرۆڤ فێری چاکی و دڵسۆزی لەکارکردن و بەرهەمهێناندا دەکات، فێری هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات.

٧- هاوسەرگیری هۆکارێکە بۆ زیادبوونی تاکەکانی کۆمەڵگە و شوێن کەوتووانی

پێغەمبەر(ﷺ) وەکو دەفەرمووێت: (تَزَوَّجُوا الْوَلُودَ الْوَدُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ الأُمَم)[٨].

واتە: هاوسەرگیری پێک بهێنن لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی کە بەسۆزن و منداڵیان زۆر دەبێت چونکە بەو بۆنەیەوە شوێن کەوتووانم زۆر دەبن.

٨- هاوسەرگیری زۆرێک لەدەرگای پەرستشەکان والا دەکات بۆ پیاوان و ئافرەتان کە بەتەنها لەم پرۆژەیەدا دەستیان دەکەوێت، وەکو پێکەوەنانی ژیانێکی خۆشبەختانە و دروست، هەروەها ئامۆژگاری کردنی یەکترو دەستەبەرکردنی مافی یەکترو سۆز و بەزەیی لەنێوانیاندا کە ئەمانە هەمووی هۆکاری نزیک بوونەوەن لەخوای گەورە تەنانەت جوتبوونیشیان پاداشتی لەسەر وەردەگرن و

[٨] - راوه النسائي وأبو داود.

بــەخێر بۆیــان دەنووســرێ، وەکــو پێغەمبــەری پێـــــشەوا(ﷺ) دەفـــــەرمووێت: ( چــــــوونە لای خێزانتان پاداشتی لەسەرە هاوەڵە بــەڕێزەکانیش فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایــا جوتبــوون (جیماع) کردن لەگەڵ خێزانــەکانمان پاداشــتی لەســـەرە؟ پێغەمبــەریش(ﷺ) فــەرمووی: ئــەی ئەگەر هاتوو ئەو ئارەزووەی خۆتان لەشــوێنێکی قەدەغەکراو (حەرام)دا جێبەجێ کرد ئایا تــاوانی لەسەر نییە؟ بەهەمان شێوە ئەگەر لەشــوێنێکی حەڵاڵدا دایبنێی پاداشتی لەسەرە.

## دەرئەنجامە باشەکانی زوو هاوسەرپێکەوەنان

١- بەدەستهێنانی گشت سوودەکانی هاوسەرگیری وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد.

٢- دەربازبوون لە گێچەڵی شەهوەت بازی و ئارەزووبازی کە زۆرێک لە لاوانی کوڕ و کچ لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا بەدەستیەوە دەناڵێنن، هەروەها هاوسەرگیری پارێزەرە مرۆڤ لە زۆربەی گوناە و تاوانەکان دەپارێزێ.

٣- زوو هاوسەر پێکەوەنان لاوان دەپارێزێ لەبوختان هەڵبەستن پێیان و لەکەردارکردنیان بە تایبەتی کچان.

٤- بەر قەراربوونی باری دەروونی و جەستەیی چونکە هاوسەرگیری مۆڵگەی سۆز و ئارامی و دڵنەوایی و دڵنیاییە، لێکۆڵینەوە

تازەکــان ئامــاژە بــۆ کاریگــەری و ســوودی هاوســەر گیری دەکــەن لەســەر بەرقــەراربوونی باری دەروونی و جەستەیی و کۆمەڵایەتی لەسەر خاوەنەکــەی، وەکــو یــەکێک لــە نووســەرە ئەوروپیــەکان دەڵێــت: قــەیرەیی خاوەنەکــەی تووشی باری دەروونی و سیفەت خراپی دەکات.

**٥**- پــەروەردەکردنێکی ڕاســت و دروســتی منــداڵان لەســایەی زوو هاوســەر پێکــەوەنان، ئەگەر هــاتوو لاو زوو هاوســەر گیری کــرد ئــەوە بێگومــان تەمــەنی خــۆی لەگــەڵ تەمــەنی منداڵەکانی زۆر جیاواز نابێت بەشێوەیەک کە لە کێشەی منداڵەکانی تــێ دەگــات و هەســت بــە نارەحەتیەکانی دەکات.

هەروەها زوو هاوسەرگیری کردن زوو منــداڵ بــوونی لــێ دەکەوێتــەوە، زوو منــداڵ بــوونیش

زیرەکـــی و لێهـــاتوویی لـــە منداڵەکـــە فەراهـــەم دەکات چونکە چاکترین و لێهاتووترین منداڵ[٧] لە ڕووی جەســـتە و ڕەوشـــتەوە ئـــەو منداڵەیـــە کـــە دایکی تەمەنی لەنێوان بیست تا سی ساڵیدایە.

## ئافرەت و مارەیی

پێویستە ئەوە بزانرێ مارەیی مافی ئافرەتە و هی خۆیەتی و مێردەکەی هیچ مافێکی بە سەرەوە نیە، بە هیچ جۆرێک پیاو بۆی نییە زۆر لە ژنەکەی بکات مارەییەکەی لێ بسێنێ و لێی گل داتەوە، یان لە مارەییەکە کەل و پەل و شتومەکی ناو ماڵی پێ بکڕێ و پێی ئامادە بکات، چونکە ئیسلام لە سەر پیاوی داناوە و ئەرکی سەرشانیەتی کە کەل و پەل و شتومەکی ناوماڵ و پۆشاکی خێزانەکەی دابین بکات و بژێویشی بدات، بەلاّم ئەگەر ئافرەتەکە بەگەردن ئازایی و بە نەفسێکی بێ گەردەوە مارەییەکەی بدات بە مێردەکەی ئەوا مێردەکەی بۆی هەیە وەریگرێ و بیخوات.

لەوبارەیەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (أيّما رجل تزوج امرأة على ما قل من المهر، أو كثر، وليس في نفسه أن يؤدي إليها حقها خدعها، فمات ولم يؤد اليها حقها، لقي الله يوم القيامة وهو زان!)[٩].

**واتە:** هەر پیاوێک ژن مارە بکات و جا مارەییەکەی زۆر بێ یان کەم، ئەگەر لەدڵ و دروونیدا وابێ کە حەقی مارەیی ژنەکەی نەدات، ئەوا فێڵی لە ژنەکەی کردووە، کاتێکیش مردوو حەقی مارەییەکەی نەدابوو، لە ڕۆژی قیامەت بە زیناکەر بەخوا دەگات.

بە ڕاستی ئەمڕۆ لێرە و لەوێ دەبینین و دەبیستین کە مارەیی زۆر بۆتە کۆسپ و لەمپەرێکی تر لە بەردەم لاوان بۆ بەئەنجام گەیاندنی پرۆسەی هاوسەرگیری.

---

[٩] - راوه الطبراني.

جـا ئـەو خێزانانـەی کـە داوای مـارەیی زۆر دەکەن بۆ کچەکانیان یان کـچەکە خـۆی داوای مارەیی زۆر دەکات، ئەوانە جۆرە خـەڵکێکن کـە هیچ جۆرە حیسابێـک بۆ ئەو واقیعـە ناکـەن کـە تیایدا دەژین، ئەوانە بیر لە ئەنجامی کچەکانیان یان خوشکەکانیان ناکەنەوە، بیر لە بەرژەوەنـدی کۆمەڵگە و ڕەوشت پاکی کۆمەڵایەتی ناکەنـەوە، بـە لایانـەوە گـرنگ نیـە کـە کۆمەڵگـە بـەرەو ڕەوشـت بـەرزی یـان بـەرەو تیاچـوون بـڕوات، نەتەوە بەرەو بەختیاری یان بەدبەختی بڕوات.

ئەوانە جۆرە خـەڵکێکن ڕزق و برقـی دونیـا و ژیان و تەماعی سامان سـەرگەردانی کـردوون و هەڵی خەڵەتاندوون.

دیارە مرۆڤی وەهاش هەیـە کـە کـێ مـارەیی زۆری پێبدات کچەکەی یـان خوشـکەکەی بـەو

کەسە دەدات، هەروەک ئەو مارەییە مافی ئەو بێت نەک ئافرەتەکە! هەروەک ئەو ئافرەتە پیتاک و شتومەکێکی ناو هەڕاجخانە بێت و خرابێتە مەزادی ئاشکراوە!

جا ئەو جۆرە کەسانە موسڵمانیشن بەڵام تاوانی ئیسلام لەوەدا چییە؟!

ئایا ئەو کارە بەجێهێنانی فەرمانی خوا و پێغەمبەرە؟ بێگومان نەخێر.

ئەو جۆرە کەسانە لە گیانی بێ گەردی ئیسلام، لەشەریعەتە بێوێنەکەی، لە جەوهەری ئایین دوورن و دوورکەوتونەتەوە، تەنیا بە ناو موسڵمانن.

ئیسلام هەموو ئەو کار و کردەوانە ڕەت دەکاتەوە کە ئەنجام دەدرێت، ئیسلام نەهاتووە بار گرانی بخاتە سەر شانی خەڵک بەڵکو ئیسلام

ڕەحمەتێکە و خوا ناردوویەتی کە ببێتـە مایـەی خۆشی و بەختیاری و ئاسـوودەیی و سـەرفرازی بۆ ئادەمیزاد.

مارەیی لە ئیسلامدا هیچ سنوورێکی بۆ دیاری نـەکراوە، نـــە بـۆ کـەمترینی مـارەیی، نـە بـۆ زۆرترینـــی مـــارەیی، هــەر شـــتێکیش کــڕین و فرۆشتنی دروست بێ، دروستە بکرێتـە مـارەیی، جا کەم بێ یان زۆر، هەروەها دروســتە ژن مـارە بکرێ لـە سـەر سـوودێکی زانـدراو، وەک بڵـێ: مارەییــت فێرکردنــی قورئــانی پیــرۆز بــێ یــان سورەتێک لە قورئانی پیرۆز.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: (إن من يمن المرأة تيسيرُ خطْبَتها، وتيسيرُ صداقها، وتيسير رَحِمِها)[10].

[10] - راوه احمد في المسند. والنسائي(حديث حسن)

**واته:** لەخێرو بەرەکەتی ئـافرەت ئەوەیـە کـە خوازبێنییەکـەی ئاسـان بکـرێ و مارەییەکـەی سووک و ئاسان بێ و زۆر نەبێ.

لەسـەردەمی جێنـشین عومـەری کـوڕی خەتتابدا رضي الله عنه مـارەیی ڕووی لـە بەرزبوونـەوە نـا، ئەوەش یەکـسەر عومـەری داچڵەکاند و وریـاتر بـۆوە، بـۆ ئـەوەی شـتەکە تەشـەنە نـەکات و ئـەنجامی خـراپ نـەدات بەدەسـتەوە، عومـەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه وتارێکیدا و تیایدا فـەرمووی: "ئاگاداربن نەکەن مارەیی ئافرەتـان زۆر بکـەن!!، چونکە گەر لە دونیادا مارەیی زۆر جێگەی ڕێز و چاکی و تـەقوای خـوا بوایـە ئـەوا پێغەمبـەر ﷺ لەهەمووومان شایستەتربوو بۆ زۆردانی مارەیی".

# وانەیەکی گرنگ بۆ ژیانی هاوسەرگیری

ئەگێڕنەوە کوڕێک ژیانی هاوسەری پێک هێنا، باوکی بەبۆنەی پێک هێنانی ژیانی هاوسەری کوڕەکەی سەردانی ماڵی کوڕەکەی کردو کاتێک دانیشت لەلای کوڕەکەیەوە داوای لە کوڕەکەی کرد کە وەرەقە و قەڵەم و مساحەیێکی(سڕێنەرەوە) بۆئامادە بکات، کوڕەکە بەسەرسوڕمانەوە وتی : باوکە بۆچی؟ هەرچی شت هەیە دابینم کردووە بۆ ماڵەکەم تەنها قەڵەم و وەرەقە و مساحە نەبێت، باوکی وتی: دەی باشە ئێستا بڕۆ ئەم سێ شتە بکڕە و بگەڕێوە، کوڕەکەی زۆر بەسەرسوڕمانەوە ڕۆیشت و قەڵەم و وەرقەو مساحەی هێنا و لای باوکیەوە دانیشت، باوکی وتی: بنووسە، کوڕەکە: چی

بنوسم باوکە؟، باوک: هەرچی ئەتەوێت بنووسە، ئەوەبوو کوڕەکە ڕستەیەکی نووسی، باوکی پێی وت: بە مساحەکە بیسڕەوە... کوڕەکە سڕیەوە، باوک: بنووسە، دیسان کوڕەکە نووسیەوە، بەهەمان شێوە باوکەکە وتی: بسڕەوە، باوکەکە دیسان وتی: بنووسە، کوڕەکە: توخوا باوکە مەبەستت چییە لەمەدا، باوکەکە وتی: بنووسە... کوڕەکە دیسان نووسیەوە، بۆ جارێکی تریش باوکەکە وتی: بیسڕەوە، جا بۆ چەند جارێک باوکەکە ئەم کردارەی بە کوڕەکەی دووبارە کردەوە، دواجار باوکەکە دەستەکانی لەسەر شانی کوڕەکەی داناو پێی وت: کوڕی خۆشەویستم ژیانی هاوسەرگیری پێویستی بە مساحە هەیە، چونکە ئەگەر لە ژیانی هاوسەرگیری مساحە (سڕێنەرەوە) لەگەڵ

خۆتدا هەڵنەگریت بۆ سڕینەوەی ئەو کردار و گوفتارانەی کە حەزی پێناکەیت لە خێزانەکەتدا هەبێت بەهەمان شێوە خێزانەکەشت وەک تۆ هەندێ کردار و گوفتار هەیە حەزی پێناکات کە لە تۆدا هەبێت ئەگەر هەریەکەتان ئەم کردار و گوفتارانەتان نەسڕنەوە لە ژیانی هاوسەریتاندا ئەوا بێگومان لە ماوەی چەند کاتێک و ڕۆژێکدا ژیانی هاوسەریتان پڕ دەبێت لەپەڕەی ڕەش.

### لە کۆتاییدا...

خوای گەورە لێمانی قبوڵ بکات و بیکات بە توێشووی قیامەتمان، وە هیوادارم توانیبێتم سوودێکتان پێ بگەیێنم.

دوا وتەم ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە دەفەرمووێت: (لم يَرَ لِلْمُتَحَابين مثل النكاح )[11].

واتە: شتێکی چاکتر لە مارەبڕین بۆ خۆشەویستان نابینم.

وآخر دعونا أن الحمدالله رب العالمين

[11] - رواه البخاري.

**سوپاس و پێزانین...**

سوپاس بۆ پەروەردگارم کـە یارمـەتی دام بـۆ بڵاوکردنەوەی ئەم نامیلکە خنجیلانەیە، هەروەها سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی هاوکـارم بـوون لە بە چاپ گەیاندنی ئەم نامیلکەیـە.. سوپاسـی تایبەت بۆ مامۆستای بەڕێز مامۆسـتا (حەسـەنی شەقڵاوە) کە ئەرکی پێداچوونەوەی نامیلکەکەی گرتـە ئەسـتۆ، سـوپاس بـۆ بـەڕێزان (مـصعب جمیل) و(سەرکەوت عزیز) کە هاوکارییان کردم لـە ڕێکخـستنی کـاری ئـەم نامیلکەیـە، خـوای گـەورە نموونـەیان زۆر بکـات و بـەر پاداشـتی بەخێری خودای میهرەبان بکەون .

سوپاس و پێزانین...

* تەفسیری ئاسان (بورهان موحەممەد ئەمین).
* ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر (ئەوا محەمەد سەعید).
* بەرەو بەختیاریی ئافرەت (جەمال حەبیبوڵلا).
* هاوسەرگیری (پشتیوان موحەممەد).
* متن فتح القريب (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی).
* پەروەردەی منداڵان لە ئیسلامدا (ناصح ئیبراهیم سازانی).

ناوەرۆک

نرخی ... دینار

بۆ ئەوەی هەموو لاوێکی موسڵمان تێبگات و بزانێت کە هاوسەرگیری چییە؟

ئامانج لە بەئەنجام گەیاندنی هاوسەرگیری چییە؟

کێ هەڵدەبژێرین وەکو هاوسەری ژین و ژیانمان؟.

ئەوەی لەو ئامیلکەیە ئاماژەی بۆ کراوە سەرەتایەکە بۆ چوونە ناو ژیانی هاوسەرگیری، تاکو هانی کوڕان و کچانمان بدرێت بۆ ئەوەی بەسەرکەوتوویی بچنە ناو پرۆسەکە و بەسەرکەوتوویی ئەنجامی بدەن إنشاالله.




